# ئادابەکانی بەڕێ کردنی مردوو

## بەوێنەوە



چاپی چوارەم
١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز

نوسینی
هەردی صابر

# ئادابەکانی
# بەڕێ کردنی مردوو

نووسینی

هەردی صابر

چاپی چوارەم		١٤٣٤- ٢٠١٣ز

ناوی کتێب: ئادابەکانی بەڕێ کردنی مردوو

نووسینی: هەردی صابر

نۆبەی چاپ: چوارەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٣ ز

تایپ و دیزاین: نووسەر

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانە: شارستان سلێمانی

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١١٣٩) ی ساڵی (٢٠١٣) ی پێ دراوە

## بسم الله الرحمن الرحيم

### پێشەکی چاپی یەکەم و دووەم :-

إن الحمد لله ، نحمده و نستعينه و نستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهدي الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، واشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ (آل عمـــــران / ١٠٢) ، ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ (النســاء / ١) ، ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ (الأحزاب / ٧٠ - ٧١) .

أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله ، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار .

لە پاش سوپاس و ستایشی فراوان و بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار و ، پاشان ناردنی صەڵەوات و سەلام بۆ سەر گیانی پاکی (محمد المصطفی) (ﷺ) و ئال و بەیت و ، یارو یاوەران و شوێنکەوتوانی بە گشتی ..

خوێنەری بەرِێز : ئەم نامیلكەیەی بەردەستت باس لە چۆنێتــی (شۆرین) و (نوێژ) و (ناشتنی) مردوو دەكات بە شێوەیەكی زۆر جوان و كورت و نایاب ، لەگەڵ ئاراستە كردنی باسـەكان بـە وێنـە بـۆ ئـەوەی زیـاتر تـێ بگـەن لـە مەبەستەكەمان ..

هیوادارم هەموو لایەك سوود و قازانجی خـۆی لێ وەربگرێـت و ببێتـە مایـەی رەزامەندی خوا و توێشووی قیامەت .

﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ * وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ * وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾

## پێشەكی چاپی سێیەم : -

إن الحمـد لله ، نحمـده و نـستعينه و نـستغفره ، ونعـوذ بـالله مـن شـرور أنفسنا وسيئات أعمالنـا مـن يهـدي الله فـلا مـضل لـه ، ومـن يـضلل فـلا هادي لـه ، وأشـهد أن لا إلـه إلا الله وحـده لا شـريك لـه ، وأشـهد أن محمـدا عبده ورسوله .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾

(آل عمـــران / ١٠٢) ، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءًۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ١ ﴾ (النـــساء / ١) ، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ (الأحزاب / ٧٠ - ٧١).

**أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله ، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الأمور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة ، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار.**

له پاش سوپاس و ستايشى فراوان و بێ پايان بۆ خواى پەروەردگار و، پاشان ناردنى صەڵەوات و سەلام بۆ سەر گيانى پاكى (**محمد المصطفى**) (ﷺ) و ئال و بەيت و ، يارو ياوەران و شوێنكەوتوانى بە گشتى ، لەسەر داواى زۆربەى خوێنەرانى بەڕێز هەڵسام بە :

١) گۆڕينى ناوەكەى لە (چۆنێتى شۆرين و نوێژو ناشتنى مردوو) ە وە بۆ (ئادابەكانى بەڕێ كردنى مردوو).

٢) پاك نووس و زياد كردنى بابەتەكە.

٣) تەحقيق و تەخريجى فەرموودەكان بە گشتى.

٤) گەورەكردنى قەبارەى ناميلكەكە لە ڕووى نوسين و وێنەوە.

**باوكى كەوسەر**

**هەردى صابر**

**( ١٤٣٢ ) ك - ( ٢٠١١ ) ز**

**كوردستان - سلێمانى - چوارباخى كۆن**

**پێشەکی چاپی چوارەم : -**

شایانی باسە بەهەمان شێوە بۆ چاپی چوارەمیش کۆمەڵێ گۆڕانکاریم بەسەرهێناوە ، بۆ نموونە:

١) گۆڕینی فۆنتەکەی لە (ئەلۆەند) ە وە بۆ (سەهیفە).

٢) پاك نووسی بابەتەکە.

٣) تەحقیق و تەخریجی فەرموودەکان سەرلەنوێ.

٤) گەورەکردنی قەبارەی کتێبەکە لە ڕووی نوسین و وێنەوە.

٥) دەستکاری و گۆڕانکاری لە هەندێ نووسیندا.

**خوێنەری بەڕێز:** هیوادارم ئەوەی کە کردوومانە جێی مایەی ڕەزامەندی ئێوەی بەڕێزو خۆشەویست بێ و، سوود بەخشیش بێت بۆ هەموو لایەك.

لە کۆتایی دا داواکارم لە خوای پەروەردگار هەموو لایەك سەرکەوتوو بکات بۆ هەموو کارێکی خێر و چاکە و، لە هەر هەڵە و کەم و کورییەکیش بمان بووریت کە بە نەزانین کردبێتمان (**آمین**)..

**باوکی کەوسەر**

**هەردی صابر**

**(١٤٣٤) ك - (٢٠١٣) ز**

## وریاكردنەوەیەك

پێویستە لەسەر موسوڵمان ئامادەیی تیا بێت بۆ ئەوەی كە ڕۆژێك دێت ئەمرێت ، ئەویش بەچی ؟

١) بە زیادكردنی كردەوەی چاك.

٢) دووركەوتنەوە لە شتە حەرام كراوەكان.

٣) هەمیشە مردن لە بیر و هۆشیدا بێت.

ئەویش لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەوا دەفەرموێ: (( أكثروا ذكر هاذم اللذات )) [١] واتە: زۆر بیر بكەنەوە لە ڕووخێنەری خۆشیەكان – كە مردنە – .

---

[١] **حسن صحيح** – (ترمذی) لە كتابی (الزهد) ، بابی : (ما جاء في ذكر الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٣٠٧) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (كثرة ذكر الموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٢٣) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الزهد) ، بابی : (ذكر الموت والإستعداد لە) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٢٥٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي / ج ٤ – ص ٥٥٣ – ح ٢٣٠٧) ، و (سنن النسائي / ج ٤ – ص ٤ – ح ١٨٢٤) ، و (سنن ابن ماجه / ج ٢ – ص ١٤٢٢ – ح ٤٢٥٨) ، و (صحيح الترغيب والترهيب / ج ٣ – ح ٣٣٣٣) دا فەرموویەتی : (حسن صحيح) ە.

## ئەوەی پێویستە لە لای مردوودا بكرێ

هەركاتێ موسوڵمانێك مرد پێویستە كە كەسانی دەوروبەری ئەم شتانە جێ بەجێ بكەن :

١) داخستنی چاوەكانی:

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ لە لای (ئەبو سەلەمە) بوو گیانی سپارد چاوەكانی بۆ داخست و ، پاشان فەرمووی : (( **إن الروح إذا قبض تبعه البصر** ))[٢] واتە : بەڕاستی گیان كاتێك دەردەكرێت چاو لە شوێنی دەچێت.

٢) جووڵان و نەرم كردنەوەی جومگەكان بۆ ئەوەی ئەو لاشەیە ڕەق نەبێت ، وە شتێك دەخرێتە سەر سكی مردووەكە بۆ ئەوەی هەڵنەئاوسێ.

٣) بە پۆشاكێك هەموو لاشەی مردووەكە دابپۆشرێ :

لەبەر فەرموودەكەی دایكە (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) كەوا فەرمووی : (( **أن رسول الله (ﷺ) حين توفي سجي ببرد حبرة** ))[٣]

---

[٢] **صحيح** - (موسليم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في إغماض الميت والدعاء له إذا حضر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٢٧) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی: (تغميض الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١١٨) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في تغميض الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٥٤).

[٣] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (اللباس) ، بابی : (البرود والحبر والشملة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٥٨١٤) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (تسجية الميت)

واتە: كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی فەرموو بە پۆشاكێكی (حیبرە)* داپۆشرا.

٤) پەلە بكرێت لە ئامادەكردنی و نوێژ لەسەر كردنی و ناشتنیدا :

لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەوا دەفەرموێ : (( أسرعوا بالجنازة ))[٤] واتە: پەلە بكەن لە ناشتنی جەنازەدا.

٥) ناشتنی لەو ناوچەیەی كە تیایدا مردووە بە تایبەت ئەگەر شەهید بوو: (( لأنه (ﷺ) يوم أحد أمر أن يدفن القتلى في مضاجعهم– أي أماكنهم– ))[٥]

---

گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٠) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في الميت يسجى) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٢٠).

* (حبرة) : جۆرێكە لە پۆشاكی یەمەنی .

[٤] **صحيح** – (بوخاری) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (السرعة بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣١٥) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الإسراع بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٨٣) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في الإسراع بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠١٥) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (السرعة بالجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٩٠٩) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في شهود الجنائز) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٧٧).

[٥] **صحيح** – (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في الميت يحمل من أرض إلى أرض وكراهة ذلك) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٦٥) ، هەروەها (ترمذی) لە كتابی (الجهاد) ، بابی : (ما جاء في دفن القتيل في مقتله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٧١٧) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (أين يدفن الشهيد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٠٠٤)

واتــە : لەبــەر ئــەوەی پێغەمبــەر (ﷺ) لــە ڕۆژی (ئوحــود) دا فەرمانیــدا کــە شەهیدەکان هەر لە شوێنی خۆیاندا بنێژرێن و نەگوازرێنەوە.

---

، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الـصلاة علـى الـشهداء ودفنهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥١٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمـذي / ج ٤ – ص ٢١٥ – ح ١٧١٧) ، و (مشكاة المصابيح / ج ١ – ح ١٧٠٤) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

# بەشی یەكەم

## شتنی مردوو

### یەكەم : حوكمەكەی:

شتنی مردوو، وە كفن كردن و نوێژ لەسەركردن و ناشتنی فەرزی كیفایەیـە، واتە: ئەگەر كۆمەڵێك موسوڵمان پێی هەڵسان ئەوانی تر لەسەریان دەكـەوێ و گوناهبار نابن .

### دووەم : ئەوانەی كەلە پێشترن بۆ شتنی مردووەكە:

**أ- ئەگەر پیاو بوو:**

١) ئەوكەسەی كە مردووەكە وەسیەتی بۆ كردووە.

٢) باوكی مردووەكە، چونكە زۆر بـە سۆزە بـۆی ، وە زیـاتر شـارەزایە بـە كوڕەكەی.

٣) پاشان نزیكتر و نزیكتر.

چونكە ئەوانەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) شۆردووە خزم و كەسەكانی خـۆی بـوون: لـە پێـشەوا (عـەلی) یـەوە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕنـەوە كـەوا فەرموویەتی : (( **غسلت رسول الله (ﷺ) فجعلت أنظر ما يكون من الميت فلم أر شيئا ، وكان طيبا حيا وميتا (ﷺ)** )) [٦]

---

[٦] **صحيح** - (حاكم) لە (مستدرك / ج ١ – ص ٣٦٢) دا لە كتـابی (المغـازي والـسرايا) ، گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٣٤٥) ، هەروەها (بەیهەقی) لـە (السنن الكبرى / ج ٣ – ص

واتە: پێغەمبەری خوام (ﷺ) شۆردەوە ، جا تەماشام كرد ئەوەی كەلە مردوودا دیارە ، هیچم نەبینی و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە زیندوویی و بە مردوویی و هەر بۆن خۆش و جوان بوو.

**ب- ئەگەر ئافرەت بوو:**

١) ئەوكەسەی كە مردووەكە وەسیەتی بۆ كردووە ، بە مەرجێ وەسێت بۆ كراو ئافرەت بێت.

٢) پاشان دایكی مردووەكە.

٣) پاشان كچی مردووەكە.

٤) پاش ئەوان نزیكتر و نزیكتر.

**ج- ژن و مێرد دروستە یەكتر بشۆرن:**

١) لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كەوا بە (عائیشە) ی فەرموو : (( **لو مت قبلي فغسلتك** ... ))[٧] واتە : ئەگەر هاتوو لەپێش منا مردی ئەوا خۆم دەتشۆرم.

---

٣٨٨) دا لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يؤمر به من تعاهد بطنه وغسل ما كان به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٣٧) ، هەروەها لە كتێبی (دلائل النبوة) دا لە كتابی (مرض رسول الله (ﷺ) ووفاته) ، بابی : (ما جاء في غسل رسول الله (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩١).

[٧] **حسن** - (ئەحمەد) لە موسنەدەكەیدا لە ژێر ناونیشانی : (مسند الأنصار – الملحق المستدرك من مسند الأنصار – حديث السيدة عائشة رضي الله عنها) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٥٩٠٨) ، هەروەها(نەسائی) لە (السنن الكبرى) دا لە كتابی (وفاة النبي) ،

**د- پیاوو ئافرەت هەردووکیان بۆیان هەیە منالێك بشۆرن کەوا تەمەنی لە حەوت** سالْ کەمتر بێت ، جا جیاوازی نیە مردووەکە نێر بێ یا مێ ، لەبەر ئەوەی عەورەتی ئەو مردووە هیچ جۆرە حوکمێکی لە بارەوە نەهاتووە .

**و- ئەگەر پیاوێ لەناو کۆمەڵە ئافرەتێکدا مرد** ، یاخود ئافرەتێ لەناو کۆمەڵە پیاوێکدا مرد ، ئەوا نابێ بیشۆرن ، بەڵکو دەبێ تەیەممومی بۆ بکەن .

**ز- دروست نیە موسوڵمان کافر بشۆرێت یاخود بینێژێ:**

لەبەر فەرموودەکەی خوای گەورە کەوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ **(التوبة : ٨٤)**

واتە: ئەی پێغەمبەر هیچ کات لەسەر هیچ لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد ، هەروەها لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەڕاستی ئەوانە باوەڕیان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو، و کاتێ کە مردیشن لە ئایین دەرچوو بوون.

---

بابی : (بدء علة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٠٧٩) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في غسل الرجل امرأته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٦٥) ، هەروەها (ابن حبان) لە کتابی (التاريخ) ، بابی : (مرض النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٨٦) ، هەروەها (دارەمی) لە پێشەکی سونەنەکەیدا ، بابی : (في وفاة النبي (ﷺ) ) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٨٠).

جا ئەگەر نەهی کرابێت لەوەی کە نوێژی لەسەر بکرێت کەلە هەموو شتێك لە پێشترە ئەوا هیچ شتێکی تریش دروست نیە کە بۆی بکرێ و ئەنجام بدرێت.

**سێیەم : ئەوەی دەکرێ لە کاتی مردوو شۆریندا :**

١) سوننەتە لە کاتی شتنی مردوودا عەورەتی داپۆشرێ و جلەکانی لەبەر دابکەنرێ و ، لەبەر چاوی خەڵکیدا نەیشوات ، چونکە بینینی بە ڕووتی دروست نیە .

**-بڕوانە: وێنەی (١)**




٢) پاشان سەری بەرز دەکرێتەوە لە نزیکی دانیشتنەکەیدا و ، وە سکی دەگوشێت بە هێواشی بۆ ئەوەی ئەگەر زیادەیەك لەپاشەڕۆ هەبێ بێتە دەرەوە ، وە ئاوێکی زۆری پێدا دەکات تا جوان پاك بێتەوە و پیسی پێوە نەمێنێت .

**بڕوانە: وێنەی (٢)**



٣) ئنجا ئەوکەسە دەستکێشێك لە دەست دەکات تا بە جوانی پاش و پێشی ئەو مردووە بشوات ، بۆ ئەوەی عەورەتی ببینێت ، یا دەستی بەر بکەوێت بە ڕووتی ، جا ئەگەر مردووەکە حەوت ساڵان بوو ئەوە زیاتر دەستی پیا دەهێنێ و دەیشۆرێت .

**بڕوانە: وێنەی (٣)**



هــەروەها (بــسم الله) لیّ دەکــات و دەســتنویّژیّکی بــۆ دەگــریّ هــەروەکو دەستنویّژی نویّژ : لەبـەر فەرموودەکـەی پیّغەمبـەر (ﷺ) کـە فـەرمووی بـە شۆرەرەکانی کچەکەی : (( إبدأن بميامنها ، ومواضع الوضوء منها ))[8] واتە: بە لا ڕاستەکانی دەست پیّ بکەن و ، وە هـەروەها بـە شـویّن دەسـت نویّژەکانی.

بەلاّم با ئاو نەچیّتە ناو لووت و دەمیـەوە ، بـەلّکو شـۆرەرەکە شـتیّ بئالّیّنـیّ بـە پەنجەیـەوە و پاشـان دەم و لـووتی مردووەکـەی پـیّ پـاك بکاتـەوە ، هـەروەها موسـتەحەببە بـە کـەفاوی (سـیدر) سـەر و ڕیـشی مردووەکـە بـشۆریّ و ، وە باقیەکەشی بەکار بیّنی بۆ لەشی.

---

[8] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (إبدؤوا في ميامن الميت) گیّڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٥) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (في غسل الميـت) گیّڕاویەتەوە بـە ژمـارە (٢١٧٢) ، هـەروەها (ئـەبوداود) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (كيف غسل الميـت) گیّڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (٣١٤٥) ، هـەروەها (ترمـذی) لـە کتـابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في غسل الميت) گیّڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٩٠) ، هـەروەها (نەسـائی) لـە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (ميـامن الميـت ومواضـع الوضوء منه) گیّڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٨٣).

**بڕوانە: وێنەی (٤ ، ٥)**






٤) پاشان لە ڕووی پێشەوە لای ڕاستی دەشوات - **هەروەکو چۆن لە وێنەی (٦) دا دیارە** -



**وە لە ڕووی دواوە هەروەکو چۆن لە وێنەی (٧) دا دیارە**



وە بە هەمان شێوە لای چەپیشی هەروا دەشوات ، لەبەر فەرموودەکەی پێشوو : (( **إبدأن بميامنها** ، .. )) [٩].

٥) پاشان ئەو شۆرینە بەو شێوەیە دووبارە و سێ بارە بکرێتەوە ، لەبەر فەرموودەکەی (ئوم عەتییە) (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێمان : (( **اغسلنها ثلاثا** )) [١٠] واتە: سێ جار بیشۆرن.

---

[٩] بڕوانە پەراوێزی (٨).

[١٠] **صحيح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (غسل الميت ووضوئه بالماء والسدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٥٣) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٦٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف غسل الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٤٢) ، هەروەها

وه له هەموو جارێکدا دەست بهێنێ بە سکی مردووەکەدا بۆ ئەوەی ئەگەر شتێ هاتە دەرەوە لە پاش و پێشی پاکی بکاتەوە و بیشۆرێت.

٦) هەروەها مردوو شۆر بۆی هەیە زیاتر لە سێ جاریش بیشۆرێت ، بە مەرجێ پێویست بکات .

٧) هەروەها سوننەتە دوا شۆردنی مردووەکە بە (کافور) بێت ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوا فەرمووی : (( **اجعلن في الغسلة الأخيرة كافورا** ))[11]

واتە: با کۆتا شتنی بە کافور بێت. چونکە بۆنێکی زۆر خۆشە و ناسراوە و ساردە و، وە بە بۆنەکەی حەشەرات دوور دەکەوێتەوە.

**بڕوانە: وێنەی (٨)**




---

(نەسائی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (غسل الميت بالماء والسدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٨٨٠).

[11] بڕوانە پەراوێزی (١٠).

٨) هەروەها موستەحەببە مردووەکە بە ئاوی سارد بشۆردرێت ، مەگەر کاتێ کە مردووەکە زۆر چڵکن بێت و پیسی پێوە دیار بێت ئەوە ئەوکاتە دەتوانێ ئاوی گەرم بەکار بهێنێت ، هەروەها دروستە سابوون بەکار بهێنێ بۆ لێکردنەوەی ئەو چڵکە، وە نابێ زۆر بە توندی بیشۆرێ لەبەر ئەوەی نەبادا پێستەکەی لێ ببێتەوە، وە هەروەها دەتوانێ بە دان پاککەرەوە ددانەکانی پاك بکاتەوە.

٩) موستەحەببە سمێڵی مردووەکە کورت بکاتەوە و نینۆکەکانی بکات ئەگەر هاتوو زیاد لە سنوور نینۆکی هاتبوو ، بەڵام مووی بەر و بن باخڵی دەستکاری ناکرێ و کورت ناکرێتەوە.

١٠) باش نیە قژی مردوو شانە بکرێت ، چونکە لەوانەیە بوەرێت ، بەڵام سەبارەت بە قژی ئافرەت دەکرێ بە سێ پرچەوە و بەردەدرێتەوە بە ناو شانیا.

١١) موستەحەببە دوای شۆردنەکەی وشك بکرێتەوە.

١٢) ئەگەر هاتوو دوای حەوت جار شۆردن پیسی لە پاش و پێشی مردووەکە – واتە : میز و پیسایی و خوێن – دەرچوو ئەوا لۆکەی تێ دەکرێ و ، وە شوێنە پیس بووەکە دەشۆرێ و دەست نوێژی تازەی بۆ دەگرێتەوە ، بەڵام ئەگەر هاتوو دوای کفن کردنەکەی پیسی لێ هاتەدەر ئەوا جارێکی تر ناشۆرێتەوە ، چونکە ئەرکی گرانترە.

١٣) ئەگەر كەسێك ئیحرامی بە (حەج) یا بە (عومرە) بەستبوو پاشان مرد ، ئەوە دەشۆرێت بە (ئاو) و (سیدر) ، بەلاَم نەبۆنی خۆشی پێوە دەكرێت ، وە نە سەری دادەپۆشرێت ، ئەگەر هاتوو لە ڕەگەزی نێر بوو :

لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كەلە بارەی ئەو پیاوەوە كە مرد بە ئیحرامەوە ، فەرمووی : (( **اغسلوه بماء و سدر و كفنوه في ثوبيه و لا تمسوه طيبا و لا تخمروا رأسه و لا تحنطوه فإن الله يبعثه يوم القيامة ملبيا** ))[12]

واتە : بیشۆرن بە ئاوو سیدر و ، كفنی بكەن لە جل و بەرگەكەی خۆیدا و ، بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەری دامەپۆشن ، چونكە لە ڕۆژی قیامەتدا بە (لبيك اللهم لبيك) زیندوو دەكرێتەوە.

١٤) شەهیدی جەنگ ناشۆردرێ : لەبەر فەرموودەكەی پێغەمبەر (ﷺ) : (( **وأمر بدفنهم في دمائهم ، ولم يغسلوا** ))[13]

---

[12] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف يكفن المحرم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٦٧) ، هەروەها (موسلیم) لە كتابی (الحج) ، بابی : (ما يفعل بالمحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٨٩) ، هەروەها (نەسائی) لە كتابی (مناسك الحج) ، بابی : (تخمير المحرم وجهه ورأسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧١٢) ، هەروەها (ابن ماجه) لە كتابی (المناسك) ، بابی : (المحرم يموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٨٤).

[13] **صحيح** - (بوخاری) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الشهيد) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٤٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (في الشهيد يغسل)

واتــە : فــەرمانی کــرد کــەوا کوژراوەکــانی (ئوحــود) هــەر بــە جــل و بەرگــە خوێناویەکانیانەوە بنێژرێن و ، نە شۆردرێن.

* بەڵێ شەهید ناشۆردرێ و، وە هەر بـە جلـەکانی خۆیـشیەوە دەنێـژرێت ، بەڵام پاش ئەوەی کە چەك و تەقەمەنیەکەی لێ کرایەوە و هیچی پێوە نـەما ئەوسا دەنێژرێت.

*** هەروەها نوێژیشی لەسەر ناکرێت:**

هەر لەبەر فەرموودەکـەی (جـابر) ی کـوڕی (عبـدالله) (خـوای لێ ڕازی بێـت) کـــەوا فـــەرمووی : (( **ولم یـصل علـیهم** ))[14] واتـــە: فـــەرمانی کـــرد کـــەوا نوێژیشیان لەسەر نەکرێت.

---

گێڕاویەتــەوە بــە ژمــارە (٣١٣٨) ، هــەروەها (ترمــذی) لــە کتــابی (الجنــائز) ، بــابی : (مــا جــاء في تــرك الــصلاة علــى الــشهید) گێڕاویەتــەوە بــە ژمــارە (١٠٣٦) ، هــەروەها (نەسائی) لە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (تـرك الـصلاة علـیهم) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٩٥٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الـصلاة علـى الشهداء ودفنهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥١٤).

[14] **صحیح** – (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (الصلاة على الشهید) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٣٤٣) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (في الـشهید یغـسل) گێڕاویەتــەوە بــە ژمــارە (٣١٣٨) ، هــەروەها (ترمــذی) لــە کتــابی (الجنــائز) ، بــابی : (مــا جــاء في تــرك الــصلاة علــى الــشهید) گێڕاویەتــەوە بــە ژمــارە (١٠٣٦) ، هــەروەها (نەسائی) لە کتـابی (الجنـائز) ، بـابی : (تـرك الـصلاة علـیهم) گێڕاویەتـەوە بـە ژمـارە (١٩٥٤) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في الـصلاة علـى الشهداء ودفنهم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥١٤).

١٥) مندالْی لەبارچوو ئەگەر تەمەنی گەیشتە (٤) مانگان ئەوە دەشۆردرێ و نوێژیشی لەسەر دەکرێ و ناویشی لێ دەنرێت : لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) : (( إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوما ، ثم يكون في ذلك علقة مثل ذلك ، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك ، ثم يرسل الملك فينفخ فيه الروح ))[15]

واتە: هەر یەکێ لە ئێوە کە خودا دروستی دەکا ، چل ڕۆژ بە نوتفەیی لە سکی دایکیا کۆ دەکرێتەوە و دەمێنێتەوە ، پاشان بە چل ڕۆژی تر دەبێ بە خوێنێکی مەیبو ، پاش ئەوەش بە چل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە گۆشتێکی جووراو ، پاشان خوای پەروەردگار مەلائیکەتێکی بۆ دەنێرێ و ڕۆح دەکات بە بەریدا.

* واتە ئەمە دوای تەمەنی چوار مانگی یە ، بەلاّم ئەگەر هاتوو پێش تەمەنی چوار مانگی بوو ئەوە پارچە گۆشتێکە و لە هەر شوێنێ بتەوێ دەینێژی و ، وە ناشۆردرێ و نوێژیشی لەسەر ناکرێت.

---

[15] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (أحاديث الأنبياء) ، بابی : (خلق آدم وذريته) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣٣٢) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (القدر) ، بابی : (كيفية خلق الآدمي في بطن أمه وكتابة رزقه وأجله وعمله) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٦٦٥) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (السنة) ، بابی : (في القدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٧٠٨) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (القدر) ، بابی : (ما جاء أن الأعمال بالخواتيم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٣٧) ، هەروەها (ابن ماجه) لە (المقدمة) دا ، بابی : (في القدر) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦).

١٦) ئەگەر مردوویەك نەتوانرا بشۆردرێ لەبەر بێ ئاوی یا لەبەر سووتاوی یا لەبەر پارچە پارچە بوون ، ئەوە بێگومان تەیەمومی بۆ دەکرێت.
شایانی باسە تەیەمومەکەش بەم جۆرەیە :
دەست دەکێشێ بە زەویدا و پاشان دەست دەهێنێ بە دەم و چاوو هەردوو دەستیا.

١٧) پێویستە لەسەر مردوو شۆر هەر شتێکی تری نائاسایی ببینێت لە مردووەکەدا ئەوە نابێ باسی بکات ، ئەویش وەك : ڕەش داگیرسانی دەم و چاوی ، یا نیشانەیەکی زۆر خراپ بە لاشەیەوە بێت ، یا هەر شتێکی تری لەو شێوەیە ، لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) : (( **من غسل مسلما فكتم عليه ، غفر الله له أربعين مرة** ))[١٦]
واتە: هەرکەسێ مردوویەکی موسوڵمان بشوات و نهێنی ئەو مردووە نەدرکێنێ ، ئەوە خوای گەورە چل جار لێی خۆش دەبێت.

---

[١٦] **صحيح** - (حاكم) لە (مستدرك) دا لە کتابی (الجنائز) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٧٣) ، هەروەها (بەیهەقی) لە (السنن الكبرى) دا لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (من رأى شيئا من الميت فكتمه ولم يتحدث به) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٢٧٠) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (صحيح الترغيب والترهيب / ج ٣ – ح ٣٤٩٢) ، و (أحكام الجنائز / ج ١ – ص٥١) دا فەرموویەتی : (صحيح) ە.

## بەشی دووەم

## کفن کردنی مردوو

١) پێویستە مردوو کفن بکرێت ، وە باشتر وایە لە پارەی مردووەکە کفنەکەش بکڕدرێت :

ئەویش لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمووی لە بارەی ئەو پیاوەی کە بە موحریمی مرد : (( وكفنوه في ثوبيه ))[17] واتە: بە بەرگ و جلەکانی خۆی کفنی بکەن.

کەواتە پارەی کفنەکەی پێش قەرز و وەسیەت و میراتەکەی دەکەوێت .

٢) ئەگەر پارەی کفنی نەبوو ئەوە ئەوکەسە بۆی دەدات کە نەفەقەی وا لەسەریەتی ، ئەمانیش بە (ئەصڵ) و (فەرع) ە وە ، وەکو باوك و باپیر و کوڕ و کوڕەزا ، ئەگەر هەر نەبوو ئەوە لە (بيت المال) پێویستە بۆی بکڕدرێت ، ئەگەر لە (بيت المال) یشدا پارە نەبوو ئەوە لە ناو موسوڵمانانندا لەسەر شانی ئەوکەسە پێویستە کە بە حاڵی بزانێت .

---

[17] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (كيف يكفن المحرم) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٢٦٧) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الحج) ، بابی : (ما يفعل بالمحرم إذا مات) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٨٨٩) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (مناسك الحج) ، بابی: (تخمير المحرم وجهه ورأسه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٧١٢) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (المناسك) ، بابی : (المحرم يموت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٠٨٤).

٣) پێویستە ئەو کفن کردنە بە جۆرێ بێت کە هەموو لاشەی مردووەکە دابپۆشێت.

٤) موستەحەببە کە لە سێ پارچەدا کفن بکرێت :

لەبەر فەرموودەکەی دایکە (عائیشە) (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی: **(( كفن رسول الله (ﷺ) في ثلاثة أثواب بيض سحولية ، من كرسف ، ليس فيها قميص ، ولا عمامة ))** [١٨]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سێ پارچە قوماشی لۆکەی سپی کە لە ناوچەی (سحول) ی یەمەنیدا دروستکراوە ، کفن کرا ، نە قەمیسیان تێدا بوو ، نە مێزەر.

٥) هەروەها سوننەتە کەوا ڕەنگی کفنەکە سپی بێت :

لەبەر فەرموودەکەی (ئیبنوعەبباس) (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : **(( البسوا من ثيابكم البياض فإنها من خير ثيابكم ، وكفنوا فيها موتاكم ))** [١٩]

---

[١٨] **صحيح** - (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (في كفن الميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٢١٧٦) ، هەروەها لە (تحفة الأشراف) دا بە ژمارە (١٧٢١٠).

[١٩] **صحيح** - (ئەبوداود) لە کتابی (اللباس) ، بابی : (في البياض) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٤٠٦١) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما يستحب من الأكفان) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٩٤٤) ، هەروەها (ابن ماجە) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء فيما يستحب من الكفن) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٧٢) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود / ج ٤ – ص ١٥١ – ح ٤٠٦١) ، و (مشكاة المصابيح / ج

واتە : پۆشاكی سپی لەبەر بكەن ، چونكە باشترینی پۆشاكەكانتانە و ، مردووەكانیشتانی تێدا كفن بكەن.

٦) هەروەها كفنەكە بۆن خۆش دەكرێت بە بۆنی (بوخورد) ، ئنجا هەندێكی بڵاودەكرێتەوە بەسەر هەندێكی تریدا ، پاشان لەسەر یەك ڕادەخرێت ، وە ئەگەر (حەنوط) هەبوو كە بۆنێكی تایبەتە بە مردوو ئەوە باشترە و دەخرێتە ناو بەینەكانیەوە.

**بڕوانە: وێنەی (٩)**



٦) پاشان مردووەكە لەسەر پشت ڕا دەكێشرێت – **هەر وەكو چۆن لەوێنەی (١٠) دا دیارە.**



---

١ – ح ١٦٣٨) ، و (صحیح الترغیب والترهیب / ج ٢ – ح ٢٠٢٦) دا فەرموویەتی : سەنەدەكەی (صحیح) ە.

پاشان هەندێ لۆكەی بۆن خۆش دەخرێتە نێوان پاش و پێشیەوە تا بۆنی ناخۆشی لێوە دەرنەچێت.

٧) هەروەها موستەحەببە پشتە مالێك بدا بەسەر جەنازەكەدا هەر وەكو چۆن لە وێنەی (١٠) دا دیارە ، بۆ ئەوەی عەورەتی مردووەكە بشارێتەوە و دیار نەبێت .

٨) هەروەها موستەحەببە كە (حەنوط) ە كە بكرێتە ئاستی دەم و چاوو لووت و گوێی و ، هەروەها شوێنی سوجدەكەی ، وە ئەگەر سەرجەم لاشەی مردووەكە بۆن خۆش بكرێ هیچ زیانی نیە ، لەبەر ئەوەی هەندێ لە هاوەڵان كردوویانە .

٩) پاشان پارچەی یەكەم دەدرێت بەسەر لای ڕاستیدا – هەروەكو چۆن لە وێنەی (١١) دا دیارە – .

پاشان لاكەی تری دەدرێ بەسەرلای چەپیدا – **هەروەكو چۆن لە وێنەی (١٢) دا دیارە.**



١٢

هەروەها بەو شێوە پارچەی دووەم و سێ یەم دەدرێ بەسەریا ، پاشان ئەو پشتە ماڵە كە درابوو بەسەر عەورەتیدا لادەبرێ – **هەروەكو چۆن لە وێنەی (١٢) دا دیارە.**

پاشان لە حەوت شوێنەوە دەبەسرێت – **هەروەكو چۆن لە وێنەی (١٥) دا دیارە.**



١٥

بۆ ئەوەی لە یەك جیا نەبێتەوە و جەنازەكەش گورج بێت – **هەروەكو چۆن لە وێنەی (١٣) دا دیارە.**



١٣

پاشان زیادەی کفنەکە دەهێنیتەوە بەسەر سەر و قاچیا و بە جوانی دەیبەستیت - **هەروەکو چۆن لە وێنەی (١٤) دا دیارە.**


١٤

پاشان لە ناو گۆڕەکەدا گرێی سەر و قاچی دەکەیتەوە ، جا ئەگەر هاتوو گرێکان لە حەوت گرێ کەمتر بوون ئەوە قەیناکا ، چونکە مەبەست لەو جۆرە بەستنە توند و تۆڵی جەنازەکەیە.

١٠) دروستە مردوو بە دوو پارچەش کفن بکرێت ، بەڵام ئەوەی کەلە پێشەوە باسمان کرد باشترە.

**١١) بەڵام ئافرەت بە پێنج پارچە کفن دەکرێ :**

أ- پشتە ماڵێ تا خوارەوە.

ب- سەرپۆشێك بۆ سەری.

ج - کراسێك بۆ بەشی سەرەوەی.

د- دوو پارچەکەی تریش بەکار دەهێنرێ بۆ کفن کردنی هەموو لاشەی.

# بەشی سێیەم
# نوێژی مردوو

**یەکەم : حوکمەکەی:**

نوێژ کردن لەسەر جەنازە فەرزی کیفایەیە ، واتــە : هەنـدێ لـە موسـوڵمانان پێی هەڵسن لەسـەر سـەرجەم موسـوڵمانان فەرزیەتەکـەی نامێنێـت و ئـیتر گوناهبار نابن.

**دووەم : سوننەتەکانی نوێژی جەنازە:**

١) ئەگەر پیاو بوو سوننەتە لە ئاستی سەری بوەستی:

لەبەر فەرموودەکەی (ئەبوغالیب) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کەوا فـەرمووی :

**(( رأيت أنس بن مالك صلى على جنازة رجل ، فقام حيال رأسه ، فجيء بجنازة أخرى ، بامرأة ، فقالوا : يا أبا حمزة صل عليها ، فقام حيال وسط السرير ، فقال له العلاء بن زياد : يا أبا حمزة هكذا رأيت رسول الله (ﷺ) صلى قام من الجنازة مقامك من الرجل ، وقام من المرأة مقامك من المرأة ؟ قال : نعم ، فأقبل علينا ، فقال : احفظوا ))**[20]

---

[20] **صحيح** – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (أين يقوم الإمام من الميت إذا صلى عليه) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩٤) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (ما جاء أين يقوم الإمام من الرجل والمرأة) گێڕاویەتەوە بـە ژمـارە (١٠٣٤) ، هـەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنـائز) ، بـابی : (مـا جـاء في أيـن يقـوم الإمـام إذا صـلى على

واتە : لەگەڵ (ئەنەسی كوڕی مالیك) دا (خوای لێ ڕازی بێت) نوێژم لەسەر تەرمی پیاوێك كرد ، جا لە لای سەریەوە ڕاوەستا ، پاشان تەرمی ئافرەتێكیان هێنا و وتیان : ئەی (ئەبوحەمزە) نوێژی لەسەر بكە ، جا لای ناوەڕاستی جێگاكەوە ڕاوەستا ، جا (عەلای كوڕی زیاد) – كاتێك بینی ڕاوەستانەكەی بۆ پیاوو ئافرەت جیاواز بوو – وتی : ئەی (ئەبوحەمزە) بەم شێوەیە پێغەمبەری خوات بینیوە ڕاوەستا بێ لەسەر تەرمی پیاو هەروەكو تۆ چۆن ڕاوەستای ، وە ڕاوەستابێ لەسەر تەرمی ئافرەت هەروەكو تۆ چۆن ڕاوەستای ، (ئەنەس) فەرمووی : بەڵێ ، جا (عەلا) بەری كردە لامانەوە و فەرمووی : ئەمە لەبەر بكەن .

**هەروەكو چۆن لە وێنەی (١٦) دا دیارە**




---

جنازة) گێڕاوییەتەوە بە ژمارە (١٤٩٤) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (أحكام الجنائز / ص ١٠٩) دا فەرموویەتی : سەنەدەكەی (صحیح) ە .

**وە بۆ ئافرەت سوننەتە لە ئاستی ناوەڕاستیدا بوەستی:**

لەبەر فەرموودەکەی (سەمورە) ی کوڕی (جوندەب) (خوای لیٚ ڕازی بیٚت) کەوا فەرمووی: (( **أن رسول الله (ﷺ) صلى على امرأة ماتت في نفاسها ، فقام وسطها** )) [21] واتە : پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) نویٚژی لەسەر تەرمی ئافرەتیٚك کرد کە مردبوو بە هۆی منداڵ بوونەوە ، جا لەوکاتەی کە نویٚژی لەسەر دەکرد لە ناوەڕاستیدا وەستابوو.

**هەروەکو چۆن لە ویٚنەی (١٧) دا دیارە**




[21] **صحيح** - (بوخاری) لە کتابی (الحيض) ، بابی : (الصلاة على النفساء وسننها) گیٚڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٣٢) ، هەروەها (موسلیم) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (أين يقوم الإمام من الميت للصلاة عليه) گیٚڕاویەتەوە بە ژمارە (٢٢٣٢) ، هەروەها (ئەبوداود) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (أين يقوم الإمام من الميت إذا صلى عليه) گیٚڕاویەتەوە بە ژمارە (٣١٩٥) ، هەروەها (ترمذی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في أين يقوم الإمام من الرجل والمرأة) گیٚڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٣٥) ، هەروەها (نەسائی) لە کتابی (الحيض) ، بابی : (الصلاة على النفساء) گیٚڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٩١).

٢) هەروەها سوننەتە پێشەوا بچێتە پێشەوە ، پاشان ئەوانی تر لە دوایەوە ، بەڵام کاتێ موسوڵمانان جێیان نەبۆوە ئەوا لەلای ڕاست و چەپی پێشەواوە دەوەستن .

٣) سوننەتە کەوا قورئان خوێندنەکەی بە دەنگی نزم بێت :

لەبەر فەرموودەکەی (ئەبوئومامە) ی باهیلی (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا هەواڵی پێ داوە : (( **أن السنة في الصلاة على الجنازة أن يكبر الإمام ، ثم يقرأ بفاتحة الكتاب بعد التكبيرة الأولى سرا في نفسه ، ثم يصلي على النبي (ﷺ) ، ويخلص الدعاء للجنازة، في التكبيرات لا يقرأ في شيء منهن ، ثم يسلم سرا في نفسه** ))[٢٢]

واتە: کەوا سوننەت وایە لە نوێژی جەنازەدا پێشەوا (الله أكبر) بکات ، پاشان (فاتحە الكتاب) پاش (الله أكبر) ی یەکەم بخوێنێت بە بێ دەنگی لەبەر خۆیەوە ، پاشان سڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات ، وە نزا بە ئیخلاصەوە بۆ مردووەکە بکات لە پاش سێ (الله أكبر) ە کەی تر ، وە لە (الله أكبر) ە کانی تردا هیچ قورئانی تێدا ناخوێنێت ، پاشان بە دەنگێکی نزم لەبەر خۆیەوە (سەلام) دەداتەوە – بە لای ڕاستیدا –.

---

[٢٢] **صحيح** – (بەیهەقی) لە کتابی (الجنائز) ، بابی : (القراءة في صلاة الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٦٥٦٤) ، هەروەها (شافیعی) لە موسنەدەکەیدا لە کتابی (الجنائز والحدود) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٢٧) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە: (إرواء الغليل / ج ٣ – ح ٧٣٤) ، و (تلخيص أحكام الجنائز / ص ٥٥) دا فەرموویەتی: (صحيح) ە.

٤ ، ٥) سوننەتە كەوا لە (الله أكبر) ی یەكەم دەست بەرز بكاتەوە ، و دەستی ڕاستیشی بخاتە سەر دەستی چەپی :

لەبەر فەرموودەكەی (ئەبوهورەیرە) (خوای لێ ڕازی بێت) كەوا فەرمووی : (( أن رسول الله (ﷺ) : كبر على جنازة ، فرفع يديه في أول تكبيرة ، ووضع اليمنى على اليسرى ))[٢٣]

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) (الله أكبر) ی لەسەر جەنازە دەكرد ، و هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە لە (الله أكبر) ی یەكەمدا ، و دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنا .

٦) هەروەها سوننەتە ئەوكەسەی كە نوێژ لەسەر جەنازە دەكات لەگەڵ هەموو (الله أكبر) ێكدا هەردوو دەستی بەرز بكاتەوە ، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەو شێوەیەی كردووە[٢٤].

هەروەها لەبەر فەرموودەكەی (عومەر) ی كوڕی (ئەبی زائیدە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) كەوا فەرمووی : (( رأيت قيس بن أبي حازم كبر على جنازة فرفع يديه في كل تكبيرة ))[٢٥]

---

[٢٣] **حسن** – (ترمذی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (ما جاء في رفع اليدين على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٧٧) ، هەروەها (دارەقوتنی) لە كتابی (الجنائز) ، بابی : (وضع اليمنى على اليسرى ورفع الأيدي عند التكبير) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٥٩٦) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (جامع الترمذي / ج ٣ – ص ٣٨٨ – ١٠٧٧) دا فەرموویەتی : (حسن) ە.

[٢٤] بڕوانە : (الفتاوى لشيخ ابن باز / ج ١٢ – ص ١٤٨).

واتە: (قەیسی کوڕی ئەبوحازم) م بینی کاتێ (الله أکبر) ی بکردایە لەسەر جەنازە بۆ هەموو (الله أکبر) ێ هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە.

٧) سوننەتە پێشەوا خەڵکەکە بکاتە سێ ڕیزەوە :

لەبەر فەرموودەکەی (ئەبوئومامە) ی باهیلی (خوای لێ ڕازی بێت) کەوا فەرمووی : (( صلى النبي (ﷺ) على جنازة ، ومعه سبعة نفر ، فجعل ثلاثة صفا ، واثنين صفا ، واثنين صفا )) [٢٦]

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر جەنازەیەك کرد و حەوت کەسی لەگەڵدا بوو، جا سیانی کردە ڕیزێك و دوانیشی کرد بە ڕیزێکی تر و وە دووی تریشی کردە ڕیزێك.

**سێیەم : چۆنێتی نوێژی مردوو :**

١) پێشەوا چوار (تەکبیر) واتە : (الله أکبر) دەکات ، لە دوای (الله أکبر) ی یەکەم سورەتی (فاتیحە) دەخوێنێت بە (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ە وە .

٢) ئنجا پاش (الله أکبر) ی دووەم صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدات ، هەروەکو چۆن لە (تەحییات) دا دەیخوێنی ، ئەویش بەم جۆرە : (( اللهم صل على محمد وعلى آل محمد ، كما صليت على إبراهيم وعلى آل

---

[٢٥] (بوخاری) لە کتێبی (رفع الیدین في الصلاة) دا گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٠٨).

[٢٦] (تەبەڕانی) لە (معجم الکبیر) دا ، بابی : (الصاد – ما أسند أبو أمامة – سلیمان بن عبد الرحمن الدمشقي) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٧٦٤٢).

**إبراهيم إنك حميد مجيد ، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد ))** ، ئەگەر بێتوو لەوە زۆر کەمتریش بڵێ هەر دروستە، وەکو وتنی: **(( اللهم صل على محمد)).**

٣) لە پاش (الله أكبر) ی سێ یەم دەپاڕێتەوە بۆ مردووەکە بەو چەشنەی کە هاتووە لە فەرموودەدا لەوانە :

أ– لە (ئەبوهورەیرە) وە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کەوا فەرموویەتی : (( **صلى رسول الله (ﷺ) على جنازة ، فقال : اللهم اغفر لحينا ، وميتنا ، وصغيرنا ، وكبيرنا ، وذكرنا وأنثانا ، وشاهدنا وغائبنا ، اللهم من أحييته منا فأحيه على الإيمان ، ومن توفيته منا فتوفه على الإسلام ، اللهم لا تحرمنا أجره ، ولا تضلنا بعده** ))[٢٧]

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر تەرمێ کرد و فەرمووی : خوایە لە زیندوو مردوو ، گەورە و بچووك و، نێر و مێ و، ئامادە بوو ئامادە نەبوومان خۆش ببە، خوایە ئەوەمان کە بە زیندوویی هێڵاوتەتەوە لەسەر باوەڕ

---

[٢٧] **صحيح** – (ئەبوداود) لە کتابی (الجنازة) ، بابی : (الدعاء للميت) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (٣٢٠٢) ، هەروەها (ابن ماجه) لە کتابی (الجنازة) ، بابی : (ما جاء في الدعاء في الصلاة على الجنازة) گێڕاویەتەوە بە ژمارە (١٤٩٨) ، هەروەها شێخ (ئەلبانی) لە (سنن أبي داود / ج ٣ – ص ٢١١ – ح ٣٢٠١) ، و (سنن ابن ماجه / ج ١ – ص ٤٨٠ – ح ١٤٩٨) دا فەرموویەتی : (صحيح) ه.

